**شُعيبُ بنُ حرب** ئەڵێ : بە باوكی عبدالله ـ **سفيان الثوري** ـ م ووت : هەواڵم پێبدە بە هەواڵێك لە سوننەت بە هۆیەوە الله عَزَّوَجَلَّ سوودم پێ بگەیەنێت ، كاتێك لە بەردەم الله تَبَارَكَوَتَعَالَىدا وەستام و پرسیاری كرد لێم دەربارەی و پێم بڵێ : { لە كوێ ئەمەت وەرگرتووە ؟ } ، ئەڵێم : ئەی پەروەردگار سفيان الثوري هەواڵی پێدام بەم هەواڵە و لەو وەرم گرت ، ئینجا من ڕزگارم بێت و تۆش بەرپرسیار بیت و لێپرسینەوەت لەگەڵ بكرێت .

سفيان ووتی : ئەی شعیب ، ئەمە جەختكردنەوەیە ، وە چ دڵنیای كردنەوەیەک! .

بنووسە : بسم الله الرحمن الرحيم

١- قورئان ووتە و كەلامی الله ـیە ، هەر لەوەوە دەستی پێكردووە و بۆلای ئەویش ئەگەڕێتەوە ، هەركەسێک جگە لەمە بڵێت ئەوا كافرە .

٢- ئیمان ووتە و كردەوە و نیەتە ، زیاد ئەكات و كەم ئەكات ، بە عیبادەت و گوێڕایەڵی زیاد ئەكات ، بە تاوان و سەرپێچی كەم ئەكات .

٣- ووتە درووست و ڕاست نابێت تەنها بە كردەوە نەبێت ، وە ووتە و كردەوە درووست و ڕاست نابن تەنها بە نیەت نەبێت ، وە ووتە و كردەوە و نیەت درووست و ڕاست نابن تەنها بەوە نەبێت پەسند و هاوڕێكی سوننەت بن .

شعیب ئەڵێ : پێم ووت ئەی باوكی عبدالله پەسند و هاوڕێكی سوننەت چییە؟!

ووتی :

٤- پێش خستنی أبي بكر وعمر رَضِيَٱللَّهُعَنْهُمَا.

٥- ئەی شعیب ، ئەوەی ئەینووسیت سوودت پێ ناگەیەنێت تاكو عثمان و علي پێش نەخەیت بەسەر ئەوانەی دوای خۆیان .

٦- ئەی شعیب بن حرب، سوودت پێ ناگەیەنێت ئەوەی ئەینووسیت تاكو شایەدی نەدەیت بۆ هیچ كەسێک بە بەهەشت یاخود بە ئاگر تەنها ئەوانە نەبێت كە رسول الله صلّ الله علیه وسلم شایەدی بۆ داون، وە هەموویان لە قریشن .

٧- ئەی شعيب بن حرب ، ئەوەی ئەینووسیت سوودت پێ ناگەیەنێت تاکو مسح کردی سەر گۆرەویت بێ داکەندنیان پێ دادوەرتر نەبێت لە شۆردنی هەردووك پێت .

ووتم : دین بە عەقڵ و ئەهواء نییە کام کردەوەیەت پێ باشتر بێت ئەنجامی بدەیت یاخود ئەنجامی نەدەیت ، یاخود بەو شێوازەی خۆت پێت باشترە بەم شێوازە ئەنجامی بدەیت بەڵکو دین بریتییە لە قورئان و سوننەت بە تێگەشتنی هاوەڵان رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ و سەلەف رَحِمَهُمُ اللَّهُ کە مسحی سەر گۆرەوی فەرموودەی صحیحی لەسەر هاتووە .

قال **المغيرة بن شعبة** : كُنتُ مع النبيِّ ﷺ في سفرٍ فأهوَيتُ لأنزِعَ خُفَّيهِ فقال دَعهُما فإنِّي أدْخَلتُهُما طاهِرَتينِ . فمسَح عليهِما

المغيرة بن شعبة ئەڵێ : لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم لە سەفەرێکدا ، وویستم گۆرەیەکانی دابکەنم بۆ ئەوەی قاچەکانی بشوات بۆ دەست نوێژ ، فەرمووی : لێیان گەڕێ من لە پێم کردوون بە دەست نوێژەوە ، ئینجا مسحی لەسەر کردن .

[ سنن أبي داود ٤٠٣١ ]

هەروەها المغيرة بن شعبة ئەڵێ : پێغەمبەر ﷺ مسحی کرد لەسەر گۆرەوی و نەعلەکانییەوە .

[ مصنف ابن أبي شيبة ١/١٩٧٣ ]

٨- ئەی شعيب بن حرب ، ئەوەی ئەینووسیت سوودت پێ ناگەیەنێت تاکو شاردنەوەی { بسم الله الرحمن الرحيم } لە نوێژدا بەلاوە باشتر نەبێت لە ئاشکرا کردن و دەرخستنی .

٩- ئەی شعيب بن حرب، ئەوەی ئەینووسیت سوودت پێ ناگەیەنێت تاکو باوەڕ نەهێنیت بە قەدەر بە خێر و شەڕیەوە ، وە شیرین و تاڵی، هەمووی لە لایەن الله عزوجل ـەوەیە .

١٠- ئەی شعيب بن حرب ، سوێند بە الله ئەوەی قەدەریەکان ئەیڵێن ئەوە نییە الله تعالى فەرموویەتی ، وە ئەوەش نییە کە فریشتەکان ووتویانە ، وە ئەوەش نییە پێغەمبەران عَلَيْهِمُ السَّلَامُ ووتویانە ، وە ئەوەش نییە ئەهلی بەهەشت و دۆزەخ ووتویانە ، وە ئەوەش نییە کە براکەیان ئیبلیس لعنه الله ووتویەتی .

الله عَزَّوَجَلَّ ئەفەرمووێت : ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَـٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾

الجاثية ٢٣

واتە : ئایە نەت بینیووە ئەوکەسەی هەوا وئارەزووی خۆی کردۆتە خوای خۆی ، الله بە زانایی گومڕای کردووە ، وە مۆری ناوە بەسەر گوێ و دڵیدا وە پەردەی بەسەر چاویدا هێناوە ، دەی جگە لە الله کێ هیدایەت و ڕێنموونیی ئەکات ؟ ئایە بیر ناکەنەوە ؟ .

وە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت : ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾

التكوير ٢٩

واتە : ئێوە ئارەزووی ڕێگای ڕاست و ئیستقامە ناکەن مەگەر پەروەردگاری جیهانیان ئارەزووی بکات و بەیەوێت .

وە فریشتەکان ئەڵێن : ﴿قَالُوا سُبْحَـٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ﴾

البقرة ٣٢

واتە : فریشتەکان ووتیان : پاکی و بێگەردی هەر شایستە بە تۆیە ، ئێمە هیچ زانست و زانیارییەکمان نییە تەنها ئەوە نەبێت کە فێرت کردووین ، بەڕاستی هەر تۆیت زاناو دانا .

وە موسی عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ ووتی : ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِى مَن تَشَآءُ﴾

الأعراف ١٥٥

واتە : ئەمە تەنها تاقیکردنەوەی تۆیە ، هەرکەسێکت بوێت بەهۆیەوە گومڕای ئەکەیت وە هەر کەسێکیشت بوێت ڕێنموونی دەکەیت .

وە نوح عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ ووتی : ﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾

هود ٣٤

واته : ئامۆژگاری من سوودتان پێ ناگەیەنێت گەر من بمهەوێت ئامۆژگاریتان بکەم ئەگەر الله بیەوێت گومڕاتان بکات ئەو پەروەردگارتانە وە هەر بۆ لای ئەویش ئەگەڕێنەوە.

وە شعیب عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ ووتی : ﴿وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًا﴾

الأعراف ٨٩

واته : بۆمان نییە بگەڕێینەوە بۆ ناو ـ کوفر و گومڕایی و بت پەرستییە ـ مەگەر الله ـی پەروەردگارمان بیەوێت .

وە ئەهلی بەهەشت ئەڵێن : ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ﴾

الأعراف ٤٣

واته : ـ ئەهلی بەهەشت ـ ئەڵێن : سوپاس و ستایش بۆ ئەوکەسەی کە ڕێنموونی کردین بۆ ئەم ڕێگایە ـ الله ـ ، وە ئێمە هەرگیز هیدایەت دراو نەئەبووین گەر الله ڕێنموونی نەکردینایە .

وە ئەهلی ئاگر ئەڵێن : ﴿قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمًا ضَآلِّينَ﴾

المؤمنون ١٠٦

واته : ـ ئەهلی دۆزەخ ـ ئەڵێن : پەروەردگارا نەهامەتی سەرشانی گرتین و زاڵ بوو بەسەرماندا ئێمە کەسانێکی گومڕا بووین.

وە براکەیان ئیبلیس لعنه الله ووتی : ﴿قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي﴾

الحجر ٣٩

واته ئیبلیس ووتی : ئەی پەروەردگاری من! بەهۆی ئەمەوە تۆ گومڕات کردم . ـ سوجدە نەبردن بۆ ئادەم ـ .

١١- ئەی شعیب ، ئەوەی ئەینووسیت سوودت پێ ناگەیەنێت تاکو نوێژ ئەبینیت لە دوای هەموو چاکێک و خراپێک ـ بەو مەرجەی موسڵمان بێت ـ ، وە جیهاد و تێکۆشان لە پێناو الله تعالی تاکو ڕۆژی قیامەت بەردەوام ئەبێت ، وە ئارام گرتن لە ژێر دەسەڵاتی دەسەڵاتداردا

ستەم كار یاخود دادپەروەر بێت .

**ووتم** : " دەسەڵاتدار ئەبێت خاوەنی تەوحید و عەقیدەیەکی پاک بێت بێت ئینجا موسڵمانان ئەبێت ئارامی لەسەر بگرن گەر ستەم کار یاخود دادپەروەر بێت نەک بە پێچەوانەوە کەسێکی موشریک و بێ باوەڕ بێت وەک ئەمڕۆ کۆمەڵێک لە ئەهلی باتڵ تاغوتەکانی سەردەم بە موسڵمان و وەلی ئەمڕی موسڵمانان ئەزانن لە کاتێکدا کافر و بێ باوەڕن بە شەرعی الله عَزَّوَجَلَّ " .

شعیب ئەڵێ : بە سفیانم ووت : هەموو نوێژەکان ؟!

**١٢**- ووتی : نەخێر، بەڵکو تەنها نوێژی جومعە و دوو جەژنەکە ـ جەژنی ڕەمەزان و قوربان ـ ، نوێژ بکە لە دوای ئەوکەسەی شارەزایت و پێی ئەزانی ، وە ئەوەشی شاراوە و نەزانراوە تۆ ئارەزوو مەندی ، نوێژ مەکە تەنها لەدوای کەسێك نەبیت متمانەی پێ بکەیت ، وە بزانیت ئەوکەسە لە ئەهلی سوننە و جەماعەیە .

ئەی شعیب گەر لەبەردەم الله عَزَّوَجَلَّ وەستایت و پرسیاری لێکردی دەربارەی ئەم ووتە و هەوالآنە ،

بڵێ : ئەی پەروردگار سفیان بن سعید الثوري هەواڵی پێداوم بەم هەوالآنە ، پاشان ئەوەی تر لێگەڕێ لە نێوان خۆم و پەروەردگاری خاوەن ڕێز و شکۆمەندم .

## سەرچاوەکان //

شرح أصول اعتقاد اهل السنة والجماعة (٣١٤) ج١ ص١٧٠

وه المخلّصيات (٣٠٣٦) ج٤ ص٨٠

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

ئامانج محمد

٥ / ربيع الثاني/ ١٤٤٣هـ